# چەقبەستوویی، نەک بنیاتنانی دەوڵەت، بۆ کوردستانی عێراق

دێنیس ناتالی
**لە ئینگلیزییەوە: ئاراز ئەحمەد محەمەد**



## سەرنجێک

کوردەکان گەورەترین نەتەوەن لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا کە خاوەنی دەوڵەتی خۆیان نین و کۆششەکانیشیان بۆ فەراهەمکردنی مافی زیاتر و هەندێجاریش بۆ سەربەخۆیی سەری بۆ شەڕی نێوخۆ، ناسەقامگیری و تا ئاستەکانی نزیک جینۆساید کێشاوە. زۆرجار عێراق چەقی خەباتی کورد بووە و پوکانەوەشی لە ساڵی ٢٠٠٣ دا وا دەردەکەوێت دەرفەتگەلێک پێشکەش بە کوردەکانی عێراق بۆ داتاشینی دەوڵەتی خۆیان بکات- هەروەها لەکارکەوتوویی عێراق لەم دواییانەدا پیشاندەری هەوڵەکانێتی بۆ

شەڕکردن دژ بە دەوڵەتی ئیسلامی (داعش). دێنیس ناتالی پسپۆڕ لەمەڕ کورد لە زانکۆی بەرگری نەتەوەیی ئەو دیدگایە گەنگەشە دەکات. دێنیس ناتالی پێیوایە بارودۆخی هەڵپەسێردراوی هەنووکەیی کوردەکانی عێراق ڕەنگە درێژە بکێشێت و لەڕاستیشدا ئەم ڕەوشە سوودگەلێک پێشکەش بە سەرکردەکانی کورد دەکات.

لە ساتی دروستکردنی حکومەتی لاوازی عێراقی فیدراڵی دوای هەرەسی دەسەڵاتی سەدام حوسەین، حکومەتی هەرێمی کوردستان بە ئاڕاستەی ئەوەی کە زۆرێک لە ڕاڤەکاران و چاودێران و کوردەکانیش بە خواستی بوون بە دەوڵەت باسی لێوە دەکەن هەنگاوی ناوە: واتە، هەنگاوی سەربەخۆیی. حکومەتی هەرێمی کوردستان، بە قۆزتنەوەی ناڕوونی دەستوری عێراقی ساڵی ٢٠٠٥، کەنارگیربوونی کۆمەڵگایی سونیی عەرەبی، ناکۆکییە مەزهەبییەکان و حکومەتی پەککەوتوویی عێراق، گەشەی بە سێکتەری وزەی خۆی داوە بەتایبەت لەو ناوچە جێناکۆکانەی کە سەرانی هەرێم بە دیفاکۆ  کۆنترۆڵی کردوون؛ هەروەها حکومەتی هەرێم گروپێکی کاریگەری پاڵپشتی بۆ لۆبیکردنی بەرژەوەندییەکانی کورد لە واشنتۆن و لە دەرەوەدا دروست کردووە. ئەم هەنگاوانەی سەرانی هەرێم بە پەلامارەکانی داعش پاڵپشتی زیاتری بەدەستهێنا، چونکە ئەو هەڕەشەیە ڕێگای بۆ حکومەتی هەرێم کردوە بۆ دەستڕاگەیشتن بە هاوکاری سەربازی ئەمریکا و وڵاتانی هاوپەیمانی، بەمەش سرانی هەرێم مەودای ئیقلیمی خۆیان فراوان کرد. لەگەڵ ئەوەشدا، حکومەتی هەرێم بە "سەربەخۆیی" هەناردەکردنی نەوت ملاملانێی بەغداد دەکات.

بەڵام بە ڕوانینێکی قووڵ لە بارودۆخی کوردستانی عێراق سیناریۆی ئاڵۆز و نارێک دەردەکەوێت کە بە سنوربەندی یاسایی، ئابوری و جیۆسیاسی دەناسرێنەوە. ڕەنگە حکومەتی هەرێم "ڕاستییەکانی سەر ئەرزی واقیع"ی بە هەل زانیبێت کە دەبێتە هۆکاری بەهێزبوونی سەروەریێتی نێوخۆیی و دانپێدانانی نێودەوڵەتی، بەڵام هەرێمی کوردستان هەر بە قەوارەیەکی گەمارۆدراوی نیمچە-دەوڵەت بەبێ هەبوونی سەروەرێتی دەرەکی دەمێنێتەوە.

ئەم بارودۆخە ئەو مانایە دەگەیەنێت کە پلە و سروشتی ئۆتۆنۆمی کورد، بە لەخۆگرتنی هەر خواستێک بۆ سەربەخۆیی،  بە بڕیاری یەکلایەنە لەلایەن دەستەبژێری کوردەوە یەکلاناگرێتەوە، بەڵکو سەربەخۆیی کورد بە داواکارییەکان، ڕێکەوتنەکان و پاڵنەری پێکهاتەکان کە لەلایەن دەوڵەتانی هەرێمی بەهێز و ئەکتەرە نا-دەوڵەتییەکانەوە ڕێکخراوە، بڕیاری لەسەر دەدرێت. ئەم کاریگەرییانە نەک تەنها پێگەی کوردی تاقیکردۆتەوە و کوردەکانی لە چوارچێوەی عێراقدا هێشتۆتەوە ئەگەرچی هەر بەناویش بێت، بەڵکو ئەم کاریگەرییانە پێچوپەنای سیاسی پێویستی دروست کردووە بەشێوەیەک کە کاربەدەستانی حکومەتی هەرێم سودی لێوەردەگرن. هێشتنەوەی بارودۆخی هەنووکەیی ڕێگای بە حکومەتی هەرێم، کە بەشێکە لە دەوڵەتی لاوازی عێراقی فیدڕاڵ،

داوە؛ مافەکان، داهاتەکان و دانپێدانان بەدەست بهێنێت. لەهەمانکاتیشدا حکومەتی هەرێم شوێن کارنامەی ناسیۆنالیستی خۆی بکەوێت کە ئەو کارنامەیە لەسەر بنچینەیی قوربانیبوون، بەرخۆدان، فراوانبوونی هەرێمی ڕۆنراوە؛ پاشانیش بە پاڵپشتی تۆڕگەلێکی نێودەوڵەتی گەشەی ئابوری کە لەسەر بنەڕەتی نەوتە بە ناشەفافی فەراهەم بکات.

## دۆخی چەقبەستوویی دوای سەردەمی صەدام

هەرێمی کوردستان کە هاوشێوەی دەوڵەتە، لە پەنای حکومەتێکی ناوەندی لاواز و هەستی نەتەوەیی لاواز و چاودێری دەرەکی لاوازدا، لە گەشەکردندایە. هەرێمی کوردستان ڕەنگە سەروەرێتییەکی بەرچاوی نێوخۆیی هەبێت، بەڵام سەروەرێتی دەرەکی نییە. سەرانی هەرێم لەڕێگەی بەدەستهێنانی پاڵپشتی و دانپێدانانی دەرەکییەوە دەیانەوێت ئەو نەبوونی سەروەرێتی دەرەکییە جێگۆرکێ پێبکەن. حکومەتی هەرێمی کوردستان لەڕێگەی گەشەپێدانی رایەڵەکانی دەرەوە لەوانەش لۆبیکردن، پەلکێشکردنی کۆمپانیاکانی بواری نەوت، حکومەتەکانی دەرەوە، زانکۆ نێودەوڵەتییەکان، ڕێکخراوەکان و ناوەندەکانی خانەی حیکمەتەوە دەیەوێت ئەو سەروەرێتییە فەراهەم بکات، کە لەڕاستیدا یارمەتیدەریشن بۆ پەرەپێدانی بەرژەوەندییەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان لە نێوخۆ و دەرەوەدا.

ئەم تایبەتمەندییانە بوونەتە هۆکاری کاریگەری دانان لەسەر ڕەفتارەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان و سوودی مەزنی بۆ کورد لە دوای سەردەمی صەدامەوە فەراهەم کردووە. گەشەپێدانی ئەو ڕایەڵانە دەستی حکومەتی هەرێمی کوردستانی کردۆتەوە وەک هاوبەشێکی بێ چاودێر دەستی بگاتە داهاتی دەوڵەت لە بەغداد بەپێی دەستوری نوێی عێراق، لەهەمانکاتیشدا حکومەتی هەرێم کیومالی کارنامەیی نەتەوەیی خۆیی بکات. بۆ ماوەی نزیکەی ١٠ ساڵێک، حکومەتی هەرێمی کوردستان پشکی ١٧% لە فرۆشی نەوتی عێراق وەردەگرت، لەو نەوتەی کە لە هەرێمەوە وەردەگیرا- ئەوە لەکاتێکدا حکومەتی هەرێم داهاتی ساڵانەی خۆی لە نزیکەی ٢,٥ ملیار دۆلاری ئەمریکییەوە بۆ ١٣ ملیار دۆلاری ئەمریکی بەرزکردۆتەوە- بەبێ ئەوەی باج بدات یان داهاتەکانی خۆی ئاشکرا بکات یاخود تەنانەت هیچ شتێک بە بوجەی گشتی حکومەتی عێراقی ببەخشێت.

سەرچاوەکانی داهاتی بەغداد بۆ گەشەپێدانی و سەقامگیریی هەرێمی کوردستان گرنگ بوون. سەرچاوەی ئەو داهاتانە نەک تەنها مووچەیی مانگانەی نزیکەی لە ٧٠% دانیشتوانی هەرێمی

کوردستانی دابین کردووە کە دەکاتە نزیەکەی ٧٢٠ ملیۆن دۆلاری ئەمریکی لە مانگێکدا، بەڵکو ئەو داهاتانە بوون بە سەرچاوەی پەیوەندی بازرگانی بۆ سەرانی حکومەتی هەرێمی کوردستان لەگەڵ سەرانی ئەنقەرەدا، ک قەبارەی ئەو پەیوەندییە بازرگانییە بە ١٠ ملیار دۆلاری ئەمریکی لە ساڵی ٢٠١٣ دەخەملێنرا. بەشێوەیەکی گشتیش ئەو پەیوەندییە بازرگانییە بریتییە بووە لە هاوردەکردنی کەلوپەل و شمەکی تورکی بۆ هەرێم. سەرباری ئەوە، حکومەتی هەرێم بە مانەوەی لە ژێر سایەی دەوڵەتێکی ناچالاکی وەک عێراق توانیویەتی وەک "عێراقەکەی تر" خۆی نمایش بکات، ئەوەش بە سەرکەوتنێکی تاڕادەیەک دیاریکراو هەژمار دەکرێت: بە سانایی هەرێمی کوردستان سەقامگیرترە و لەڕووی ئابوورییەوە کاراترە هەتاوەکو بەغداد.

کاربەدەستانی کورد لە قەیرانی سیاسییش سوودیان وەرگرتووە بە پشتگوێخستنی کێشەگەلێکی گەنگەشەئامێز بەبێ چارەسەر وەک ململانێ ئیقلیمییەکان، سەرچاوەکانی سامانی سروشتی و تەرخانکردنی داهات. بۆ نموونە، هەرچەندە مەسعود بەرزانی کە سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستانە، بە ئاشکرا دەڵێت کە "کەرکورک دڵیبریندراری کوردستانە،" بەڵام بەڕەسمی خۆی پاراستووە لە پێوەلکاندنی کەرکوک بەهەرێمی کوردستانی سەربەخۆوە چونکە ئەو پێوەلکاندنە دەبێت هۆکاری کەمینەیی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان (جێگای ئاماژەپێدانە کە هەردوو نەیاری سەرەکی کە یەکێتی نیشتیمانی کوردستان و بزوتنەوەی گۆڕانە چەند بەشێکی هەولێر، کەرکوک و سلێمانیان کۆنترۆڵکردوە).

بڕیاردان لەسەر چارەنوسی کەرکوک- ئیتر ئەو بڕیاردانە لەژێر سایەی دامەزراوەیی یاساییدا بێت یان حکومەتی عێراقی، یان حکومەتی هەرێم یان کارگێڕی نێوخۆیی وەک پێگەیەکی تایبەتی پارێزگاکە- گەنگەشەئامێزە بەڕەچاوکردنی ئەوەی کە ناوچەیەکی دەوڵەمەندە بە نەوت و فرە ئیتنیکی و فرە ئاینیشە، پاشان دەبێت ڕەچاوی میراتی مێژوویی پرۆسەی بە عەرەبکردنیش بکرێت. لەکاتێکدا زۆرینەی عەرەب و تورکمانەکان کەرکوک وەک بەشیکی سەرەکی لەعێراق دەزانن، کوردەکان کەرکوک وەک ناوچەیەکی نیشتیمانی خۆیان دادەنێن و بە سەرچاوەی داهاتی نەوت لێی دەڕوانن کە دەتوانێت یارمەتی حکومەتی هەرێمی کوردستان بۆ بەدەستهێنانی سەربەخۆیی ئابوری بدات. هەروەها داواکارییەکان لەهەمبەر کەرکوک بەشێکن لە هاوسەنگی ناوەکی هێزی سیاسی نێوخۆیی کە ڕەنگدانەوەی دابەشبوونی جوگرافیین لەنێوان پارتی دیموکراتی کوردستان، یەکێتی نیشتیمانی کوردستان و بزوتنەوەی گۆڕاندا. ئەم پاڵنەرە بزوینەرانە کاریگەری لەسەر هەڵسوکەوتەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان لە پەیوەست بەکەرکوک و ناوچە چیناکۆکەکانی تردا هەیە.

بە فەرامۆشکردنی سنورە ئیقلیمییەکان بە نارۆشنی لەرووی سیاسییەوە، کاربەدەستانی حکومەتی هەریمی کوردستان پەرە بە ئەفسانەی بەقوربانی بوون دەدەن، ئەوەش دەبێتە رەوایەتیدان بە مەسەلەی نەتەوایەتی و لەبیربردنەوەی بارگرژییە سیاسییە نێوخۆییەکان و داواکارییەکان بۆ چاکسازی، پاشان کردەی بە نارۆشنی هێشتنەوەی سنورە هەرێمییەکان وەک "خەبات دژ بە بەغداد" لەنێو دانیشتوانی نێوخۆیی هەرێمدا سەدا دەداتەوە. داواکارییە تاک لایەنەکانی کورد بۆ ناوچە جێناکۆکان بە بانگەشەی شەرێکە کە "لە خوێنی کورددا نەخشێنراوە" پاساو دراوەتەوە. بەهەمان شێوە، مەترسی زۆری هەناردەکردنی نەوت لە چوارچێوەی "مافە نەتەوەییەکانی کورددا" جێگای بۆ کراوەتەوە.



## تێکشکاندنی دۆخی چەوبەستوویی

حکومەتی هەرێمی کوردستان هەوڵی داوە ئەو دۆخە سیاسییە چەقبەستووە بە بەدەستهێنانی ئابوری سەربەخۆ تێکبشکێنێت. گرنگترین هەوڵی حکومەت ئامانجی گەشەپێدانی سەرچاوەی داهاتی ئۆتۆنۆمییە کە بتوانێت داهات بۆ حکومەتی هەرێمی کوردستان دابین بکات بەبێ گەڕانەوە بۆ بەغداد. لە ساڵی ٢٠٠٥ وە، حکومەتی هەرێمی کوردستان، لەرێگەی سەرنجراکیشانی کۆمپانیا جیهانییەکانی بواری نەوت بۆ هەرێمی کوردستان و بنیاتنانی ژێرخانی بۆری گواستنەوەی نەوت و

بەستنەوەی ئەو بۆرییە نەوتیانە بەشێوەیەکی تاکلایەنە بە بۆرییە نەوتییەکانی حکومەتی عێراق-تورکیا کە حکومەتی عێراق خۆی خاوەنداریێت دەکات، بەشێوەیەکی جەربەزانە گەشەی بە سێکتەری وزەی خۆی داوە؛ پاشانیش دانوستان سەبارەت بە گرێبەستی ٥٠ ساڵەی وزە و کۆنترۆڵکردنی دیفاکتۆیی چەند ناوچەیەکی نەوتی کەرکوک و هەندێک ناوچەیی پەیوەندیداری سامانی نەوتی تر.

ڕاستییە نوێیەکانی سەر ئەرزی واقیع وایان لە حکومەتی هەرێمی کوردستان کردووە کە سیاسەتی 'داهاتی کەم و زانینی سەرچاوە مەترسی" پەیڕەو بکات، ئارەزوومەندانە و بەبێ پرسکردنیش بە بەغداد نەوت هەناردە بکات. سەرانی حکومەتی هەرێم لە کۆششەکانیان لە دانوستانەکاندا لەگەڵ حکومەتی عێراقی شکستیان هێنا و نەیانتوانی ڕەزامەندی بەغداد وەربگرن بۆ فرۆشتی نەوتی خاوی هەرێم لەرێگای کۆمپانیایی سۆمۆوە، نوێترین شکستیش ڕێکنەکەوتن بوو لەسەر "نەوت-بەرامبەر-داهات" لە مانگی ١٢ی ٢٠١٤ دا. سەرانی بەغداد جەخت دەکەنەوە لەسەر سەروەریێتی دەوڵەت لەدەستڕاگەیشتن بە سەرچاوەکانی سامانی سروشتی نەوتی عێراق، فرۆشتنەکان و داهاتەکان، پاشانیش شەفافییەتی تەواوی سێکتەری نەوتی هەرێم کە هاوبەشی دەکات لە دابینکردنی بوجەی نیشتیمانی عێراق. سەرانی هەولێریش داوای جڵەوگرتنە دەستی نەوتی خاوی خۆیان و داهاتەکان دەکەن، ئەوە سەرەڕایی ئەوەیی ئەو داهاتە ناڕوونە، پاشانیش سەرانی هەولێر داوا لە بەغداد دەکەن پارەی فرۆشی ئەو نەوتە خاوەیان بۆ بنێرێت. دابەزینی نرخی نەوت بۆ نیو ئەوەندەی نرخی پێشوویی، قەیرانی ئابوری عێراق و پاڵپشتی هاوپەیمانان بۆ حکومەتی هەرێمی کوردستان لە شەڕکردن دژ بە دەوڵەتی ئیسلامی (داعش) هۆکار بوون بۆ دروست بوونی بەربەست لەبەردەم دانوستانەکاندا. لەبەرامبەریشدا و لە مانگی ٩ی ٢٠١٥ دا، حکومەتی هەرێمی کوردستان نەوتی خۆی هەناردەی دەرەوە بەبێ ڕەزامەندی بەغداد کرد، بڕی هەناردەکردنەکەش نزیکەی ٦٢٠،٠٠٠ بەرمیل دەبێت لەڕۆژێکدا و لەرێگەی بورییە نەوتییەکانی حکومەتی عێراق-تورکیا ڕەوانەی کردوون، لەو ژمارەیەش بڕی ٤٦٠،٠٠٠ بەرمیل لە گێڵگە نەوتییەکانی ناوچەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە ڕەوانە کراوە و ئەوەی تریش لە بیرە نەوتییەکانی کەرکوکەوە ڕەوانە کراوە کە لەلایەن کۆمپانیایی نەوتی باکوری عێراقەوە کارەکانی دەکرێت.

حکومەتی هەرێمی کوردستان نەیتوانیوە هێشتا ئۆتۆنۆمی ئابوری بەدەست بهێنێت. لەبەرئەوەی هەرێمی کوردستان قەوارەیەکی سەروەر نییە و بەبەردەوامی پشت بە ژێرخانی لوولەیی بورییە نەوتییەکانی حکومەتی عێراق دەبەستێت، هەربۆیە هەناردەکردنی نەوتەکەی بەتەواوی سەربەخۆ نییە. سەرانی بەغداد مافی یاسایی نێودەوڵەتیان لەمەڕ هەناردەکردنی نەوت و بەدەستهێنانی داهاتەکان کە لە ڕێککەوتنامەی تاریف لەگەڵ تورکیادا دانوستانی لەسەر کرا هەیە- ئەوە جگە لەوەی سکاڵایان دژ بە سەرانی ئەنقەرە لە ژووری بازرگانی نێودەوڵەتی لە پاریسی پایتەختی

فەرەنسا تۆمار کردووە. هەروەها سەرانی بەغدا هەڕەشەی سزادانی کۆمپانیا نێودەوڵەتییەکانیان و کۆمپانیاکانی بواری هەناردەکردنی نەوت، بەتایبەت ئەو لایەنانەی نەوتی خاوی هەرێم بەبێ گەڕانەوە بۆ سۆسمۆ دەکڕن؛ ئەمەش مەترسییە یاساییەکان بەهێز دەکاتەوە، پاشانیش ناڕوونی سروشتی هەناردەکردنی نەوتی هەرێم و فرۆشتنی دەردەخات. سەرباری ئەوەش، سەرانی بەغداد بەشە بوجەی حکومەتی هەرێمی کوردستانیان بڕیوە کە بریتییە لە ٩٥% خەرجییەکانی تەشغیلی حکومەتی هەرێم (بەلام حکومەتی بەغداد هێشتا بەشە خۆراکی مانگانەی حکومەتی هەرێم دابین دەکات).

جیابونەوەی ئابوری حکومەتی هەرێمی کوردستان لە بەغداد کاریگەری ڕاستەوخۆیی لەسەر باری سەقامگیری نێوخۆیی و چالاکی ئابوری هەیە. لە نائامادەگی پاڵپشتێکی دارایی بۆ جێگرتنەوەی بەغداد، (بەهاتنی مانگی ٦ی ٢٠١٤ حکومەتی هەرێمی کوردستان هیچ پاشەکەوتێکی دارایی لە بانقە ناوەندییەکانیدا نەبوو) قوماری نەوتی حکومەتی هەرێم لەگەڵ تورکیادا بووەتە هۆکاری تێکشکاندن و ناسەقامگیرکردنی ژینگەی دانیشتوانی نێوخۆیی هەرێم و بوارە ئابورییەکەشی تێکداوە. مووچەی فەرمانبەرانی حکومی بۆ ماوەی چەندین مانگ نەدراوە، هەزاران ئالوگۆڕی بازرگانی نێوخۆیی داخراون، کارمەندانی کۆمپانیا بیانییەکانی بواری نەوت مووچەکانیان لەکاتی خۆیاندا نەدراوە و بەقەرزە، وەبەرهێنانی نوێ وەستاوە و نزیکەی ٢٥،٠٠٠ کورد لەماوەی هەشت مانگی ساڵی ٢٠١٥ دا کە زۆربەیان لە توێژی خوێندەواری گەنجن هەرێمی کوردستانیان بەرەو دەرەوە بەجێهێشتووە. کوردەکان بە ملیار پارەیان لە سەرانی ئەنقەرە و خاوەکارانی نێوخۆ قەرز کردووە، لەکاتێکدا حکومەتی هەرێم بە نایەکسانی کاری فرۆشی نەوت لە ٢٠١٦ دا دەکات، ئەوەش بەمەبەستی دابینکردنی خەرجییەکانی تێچوون و دابینکردنی ٢٢ ملیار دۆری ئەمریکی قەرزکراو کە لە ماوەی ساڵی ڕابردوودا بە کەڵەکەبوویی مابوویەوە. ئەم گوشارە ئابوورییانە هاوکاتە لەگەڵ قەیرانی سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان کە تیایدا چاکسازان و کاربەدەستانی پارتە سیاسییەکان و گروپە بەرهەڵستکارەکان ڕەوایەتی پێگەی مەسعود بەرزانی وەک سەرۆکی هەرێم دەخەنە بەر تەشەری گومانەوە. سەرۆکایەتی مەسعود بەرزانی لە بەرواری ١٩-٨-٢٠١٥ دا کۆتایی پێهات و داواکارییەکانیش بۆ چاکسازی سیاسی لەئارادان.

بەرەچاوکردنی ئەوەی کە چیتر بەغداد پارە بۆ حکومەتی هەرێم دابین ناکات، بەلایەنی کەمەوە لە ئێستادا، پەککەوتەی دامەزراوەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان لێ بەدەرکەوت؛ لەوانەش نەبوونی میکانیزمی شەفاف، ناڕوونی داهات و گەندەڵی کوشندەی گروپگەلێکی کاربەدەستی حکومی. ئەم کێشانە بوونەتە هۆکاری سەرەکی ڕەخنەگرتن لە نێوخودی حکومەتی کوردی و کۆمەڵگاکەشدا. کاربەدەستان لە کۆمیتەی نەوت و گاز لە پەرلەمانی کوردستانی عێراقدا دڵنیانین لەوەی ئاخۆ چەند لە داهات لە فرۆشی نەوتی هەرێمەوە دێت و پاڵپشتییە داراییەکان لە کوێیەوە

دابین دەکرێن. لە کۆی ١٦ بانکی حیسابی کە گوایە داهاتی فرۆشی نەوتی هەرێم لەوێدا پاشەکەوت کراوە؛ وەزیری دارایی حکومەتی هەرێم کە بەم دواییانە لەلایەن پارتی دیموکراتی کوردستانەوە لە پەرلەمان دەرکرا تەنها دەستی بە یەک بانقی دەگات کە ئەویش بانگی تورکی هۆڵ بانکە، ئەم بانقەش تەنها ١٤ ملیۆن دۆلاری ئەمریکی پاشەکەوتی هەیە. وەزیری سامانە سروشتییەکانی و سەرۆک وەزیران نێچیرڤان بەرزانی هەموو حیسابی ١٥ بانقەکەی تریان قۆرخکردووە.

بەرەچاوکردنی قەیرانی دارایی بەغداد و هەولێر، پاشان بانگەشە چارەسەرنەکراوەکان سەبارەت بە جڵەوگیری هەناردەکردنی نەوت و دابینکردنی پارە، هیچ جێگای سەرسورمان نییە کاتێک کاربەدەستانی کوردی دەگەڕێن بەدوای ئامرازی تردا بۆ دابینکردنی داهات. کاربەدەستانی کورد سەرچاوەیەکی داهاتی متمانەپێکراویان دەوێت بتوانێت هاوکاریان بێت گەشە بە هەرێمە بدات و پارێزگاری لە دانیشوانەکەش بکات. بەڵام بە تێپەڕاندنی بەغداد بەبێ هەبوونی دامەزراوەی پێویستی یاسایی، دارایی و سیاسی، حکومەتی هەرێمی کوردستان هەرێمی کوردستانی خستۆتە بەرمەترسی بەرهەڵستی سیاسی و دارمانی ئابورییەوە. لەجیاتی لۆمەکردنی بەغداد بۆ قەیرانە دارایی و سیاسییەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان، لە ئێستا دانیشتوانی نێوخۆ بە توندی ڕەخنە لە حکومەتی هەرێم دەگرن. ئەو بزوتنەوە بەرهەڵستکارییە لە نێوخۆیی هەرێمی کوردستاندا لە ماوەی ڕابردوودا بە ڕاپەڕینی توندوتیژ و کوشندە لە پارێزگای سلێمانیدا خۆی مانیفێست کرد، ئەوەش بووە هۆکاری زیاتری پەرتبوونی سیاسی و ناسەقامگیری.

حکومەتی هەرێمی کوردستان نەشیتوانیوە ناکۆکییەکانی لەسەر ناوچەکان و مەسەلەی هایدرۆکاربۆندا لە نێوخۆیی عێراقدا چارەسەر بکات. بە چەندین ڕێگا بارودۆخی خۆی سەختتر کردووە. بەرەچاوکردنی ئەو ڕاستییەی کە حکومەتی هەرێم جڵەوی دیفاکتۆیی بۆ سەر زەوییەکی بەرفراوان هەیە، حکومەتی هەرێم لە ئێستادا دەبێت بەرپرسیار بێت لە بەڕێوەبردن و سەقامگیرکردنی سنورێکی ١٠،٠٠٠ کیلۆمەتری لەگەڵ داعش و گروپە ناسیۆنالیستە عەرەبەکاندا. ڕەنگە لەڕۆژگاری ئەمڕۆدا حکومەتی هەرێم بتوانێت سوود لە پاڵپشتی سەربازی هاوپەیمانان وەربگرێت بۆ پاراستنی سنورەکانی خۆی، بەڵام ئەو پاڵپشتییە سەربازییە هیچ گەرەنتییەکی لەگەڵ نییە ئاخۆ هەتاوەکو کەی بەردەوام دەبێت. سەرانی بەغداد و چەندین لایەنی تری جیاوازی پەیوەندیداری نێوخۆیی بەردەوام لە بانگەشەکردن بۆ خاوەندارێتییان بۆ ئەو ناوچانە و سامانە سروشتییەکەی، بە لە خۆگرتنی دانیشتوانی کەرکوک و عەرەبە سونەکان و گروپی کەمینەکانیش. هەندێک لەم گروپانە ڕەنگە ڕەزامەند بن بەوەی بچنە سەر هەرێمی کوردستان، بەڵام گروپگەلێکی تریان دەیانەوێت هەرێمی تایبەت بە خۆیان یان پێگەی تایبەت بە خۆیان لە نێو دەوڵەتی عێراقدا دروست بکەن.

## گۆڕینی شوێنکەوتەیی/وابەستەیی

هەمــوو ئەم وەرچاخانــانە وای لە حکــومەتی هەرێمــی کوردســتان کــردووە وابەســتەی وڵاتە ئیقلیمییەکـان بە تـایبەت تورکیـا و ئێـران بێت. بە هـۆی ئەوەی حکـومەتی هەرێمـی کوردسـتان بە تەواوی پشت دەبەستێت بە یەک ڕێگای گواستنەوە و یەک ڕێگای بۆری یاسایی مشتومڕئامێزی نەوت کە بە نێو تورکیـا و نـاوچەی جەنگدا دەڕوات، ئەوە وادەکـات هەرێمـی کوردسـتانی لەڕووی ئابوورییەوە زیاتر بێ بەرگری بێت وەک لەجاران.

لە ڕۆژگـاری ئەمـڕۆدا هەنـاردەی نەوتـی هەرێـم و داهاتەکـانی بەسـتروانەتەوە بە سیاســەتی نێوخـۆیی تورکیـا و نـاکۆکی ٣٠ سـاڵەی ئەو وڵاتە لەگەڵ پـارتی کرێکـارانی کوردسـتان (پەکەکە). پەکەکە هێزەکانی لە هەرێمی کوردستان و ڕۆژهەڵاتی سوریا و باشوری ڕۆژهەڵاتی تورکیادا هەن و چەندین جاریش هێرشیان بۆ سـەر بۆرییە نەوتییەکانی نێوان عێراق-تورکیا و چەند گۆکایەکی وزەش لە تورکیــادا کــردووە. تەحەداکــانی پەکەکە بەرزانــی و پــارتی دیمــوکراتی کوردســتانیش دەگرێتەوە، پەکەکە لەگەڵ پارتیدا لە کێبڕکێدایە بۆ سـەرکردایەتی کردنی چڤاکی کوردی و تەنانەت پەکەکە پارتی بە "خیانەت بۆ تورکیا" تۆمەتبار دەکات. ئەم کەڵێنانەش باشتر دەردەکەون بەهـۆی نـاڕوونی و سروشــتی شەخصــی گرێبەســتەکانی وزەی نێـوان حکــومەتی هەرێمــی کوردســتان و سەرانی ئەنقەر. ئەو گرێبەستانە بەشێوەیەکی تایبەتی لە نێوان بەرزانی و ڕەجەب تەیب ئەردۆغانی سەرۆکی تورکیادایە ئەنجامدراوە، نەک گرێبەستگەلێک بن لەسـەر بنەمـای ڕێکخراوی دامەزراوەیی. هەر گۆڕانکـارییەک لە پێگە و کـاریگەری هەر یەکێک لەو کەسـایەتیانەدا ڕووبـدات یـان ئەگەر هەر گۆڕانکارییەک لە سیاسەتی نێوخۆیی تورکیـادا بێتەئـاراوە ئەوا کاریگەری دەکاتە سـەر بەندەکان و سروشتی ئەو ڕێکەوتنامانە، وە بەشێوەیەکی ڕاستەخۆتر لێکەوتەی لەسـەر هەناردەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان دەبێت.

هەروەهـا، ئێـرانیش بەردەوامە لە کـاریگەری دانـان لە سـەر کێڵگەکـانی ئـابوری، سیاســەت و ئاسایشــی حکــومەتی هەرێمــی کوردســتان. ئێـران بەهـۆی هاوســنوری بەرفراوانــی لەگەڵ هەردوو پارێزگای سلێمانی و هەولێردا توانیویەتی دەرچەیەکی تری هەرزان لەڕێگەی تەنکەرەوە بۆ نەوتـی خـاو و بەرهەمەکـانی تـری نەوت کە سـوودێکی گەورە بە حیـزبە کوردییەکـان بەتـایبەت یەکێتـی نیشتیمانی کوردستان دەگەیەنێت دابین بکات، پاشانیش کۆمپانیا پەیوەندیدارەکانی بواری نەوت. ئەم ئاڵوگۆڕیــانە بەبەراورد بە چالاکییەکـانی تەنـکەرە نەوتییەکـانی سـەر سـنوری نێـوان تورکیـا و کوردستان گەلێک بچوکترن، بەڵام گواستەنەوەی نەوت بە تەنکەر بۆ ئێران هـاوپێچە بە وەبەرهێنـان

و کاری بازرگانی و پەیماننامەی ئەمنی لە نێوان سەرانی تاران و حکومەتی هەرێمدا کە تیاشیادا جەخت دەکەنەوە لە پاراستنی بەرژەوەندییەکانی ئێران لە ناوچەکەدا. هەر لەساتی پەلاماری داعشەوە لە مانگی ٦ی ٢٠١٤ دا، کاریگەری ئێران بە تایبەت لە پارێزگاکانی سلێمانی و کەرکوکدا زیادی کردووە، کە تیایاندا سەرانی تاران هاوکاری سەربازی و ئەمنی دابین دەکەن شانبەشانی پێشمەرگەکانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان، میلیشیا شیعەکان، هێزە ئەمنییەکانی عێراق و چەکدارانی کوردی سوریا (یەپەگە).




بەڵام ئەم پێشهاتانە لە پەیوەندییە ئیقلیمییەکاندا نەبوونەتە هۆکاری پاڵپشتی بۆ پرۆژەی ناسیۆنالیستی کوردی. سەرەڕای سودەکانی ئاڵوگۆڕی بازرگانی لەگەڵ حکومەتی هەرێمی کوردستاندا، نە تورکیا و نە ئێران پشتگیری سەربەخۆیی کورد ناکەن، یاخود تەنانەت پشتگیری هەرێمێکی گەورەی ئۆتۆنۆمی کوردستانیش ناکەن. هەردوو ئێران و تورکیا پابەندن بە هێشتنەوەی سەروەریتی دەوڵەتی عێراق کە هاوکاریان بێت بتوانن کاریگەری لەسەر کوردەکان و چڤاتی سونی

و چڤاتی شیعەکانیش بەجێبهێڵێت. هەروەها تورکیا و ئێران بەردەوامن لە کاری لەپێشینەی خۆیان کە پاراستنی سەقامگیری هەرێمەکانی خۆیانە، ئەوەش بە چاودێریکردنی چڤاکی ناسیۆنالیستی کورد لە ناوخۆ و بەدرێژایی سنورەکانی خۆیان لەڕێگەی بەهێزکردنی لایەنی ئەمنی و پەیماننامەی سیاسی و ئابوری لەگەڵ کوردەکانی عێراقدا.

## لێکەوتەکان

هەموو ئەو وەرچەرخانانە ئاماژە بە ئیسفەنجبوون و پەرتبوونی ڕێگای کورد دەدەن نەک ڕۆشتن بۆ پێشەوە بە ئاراستەی سەربەخۆییدا. هەر گۆڕانکارییەک لە پەیوەندییەکانی نێوان سەرانی بەغداد و تورکیادا، تواناکانی ئێران–تورکیا، دەستڕاگەیشتن بە ژێرخانی لوولە نەوتیەکان، بارگرژییەکانی نێوان تورکیا–پەکەکە، پێگەی سیاسی ئەردۆغان، سەقامگیری حکومەتی عێراقی، گرژییە نێوخۆییەکانی نێوان کوردەکان، نزیکبوونەوی نێوان سونە و شیعەکان، یاخود بەهێزبوونی هەرێمی سونەی عەرەب ئەوا کاریگەری دەکاتە سەر هێز و توانای هەناردەی نەوتی حکومەتی هەرێمی کوردستان و دەستگەیشتنی هەرێم بە داهاتەکان بەبێ بەغدادا.

هەروەها سروشتی وابەستەیی حکومەتی هەرێمی کوردستان و کارنامە ناسیۆنالیستییەکەی و دابەشبوونە نێوخۆییەکەی کاریگەری لەسەر کۆششکانی ئەمریکا لەشەڕی دژ بە داعشدا هەیە. هەرچەندە پێشمەرگەی کوردەکانی عێراق هاوبەشێکی نێوخۆیی گرنگن و حکومەتی هەرێمی کوردستانیش هاوپەیمانێکی سەرەکی ئیقلیمیی ئەمریکایە لەشەڕ دژ بە داعشدا، بەڵام ستراتیجییەتی سەرانی هەرێم بریتییە لە بەهێزکردنی چەسپاندنی جڵەوگیری ناوچەیی خۆیان، ئەوە هەرچەندە دژ بە داعشیش شەڕ دەکەن. لەزۆر ڕێگاوە، حکومەتی هەرێمی کوردستان پێویستی بەوە هەیە کەمپەینی شەڕ دژ بە داعش بەردەوامی پێبدات چونکە هاوکاری سەربازی دەرەوە بەدەست دەهێنێت و دانپێدانانی نێودەوڵەتی و کاریگەری ستراتیجی گەشە پێدەدات، پاشان بەردەوامی دان بەو کەمپەینە دژ بە داعش ڕەوایەتی بە هێزی خێزانی بنەماڵەی بەرزانی دەدات و لەهەمانکاتیشدا بەرزانی بە گوشاری نێوخۆیی جێگۆڕکێی کێشە سیاسییەکان دەکات.

ئەم بزوێنەرە نێوخۆییانە هاوکاتە لەگەڵ قووڵبوونەوەی پەرتبوونی کوردەکان خۆیان، کە ڕێگریان لێدەکات پێکهاتەیەکی یەکگرتوویان لەشەڕکردن دژ بە داعشدا هەبێت. ئەم بارودۆخانەش ئاماژەن بۆ ڕەچاوکردنی کوردەکان بە پلەی دووەم و سێیەم لە گرنگییاندا لە جەنگی دژ بە داعش لەدەرەوەی سنوری یاساییان، پاشان هەموو ئەوانە دەریدەخەن کە پاڵپشتی سەربازی و

لێنەپرسینەوە لەو هاوکارییە سەربازییە چەندە دەتوانێت بەنزین بە ئاگری ناکۆکی نێوخۆیی چڤاکی و ناکۆکی نێو کورددا بکات. لەبەرئەوە ئەمریکا پێویستە وەک لایەنێکی هاوسەنگی ڕاگر هەستێت بەکارەکانی و چەک بۆ حکومەتی هەرێمی کوردستان لەڕێگەی حکومەتی عێراقییەوە دابین بکات، نەک ڕاستەوخۆ حکومەتی هەرێمی کوردستان چەکدار بکات، لەوەش زیاتر لەنزیکەوە چاودێری دابەشکردنی ئەو چەکانە لەهەولێر و هەرێمی کوردستاندا بکات. دواتریش ئەمریکا دەتوانێت هاوکار بێت لە سەقامگیرکردنی ئەو ناوچانەی کە لەدەرەوەی دەسەلاتی دەوڵەتی عێراقدان بۆ ئەوەی ئەو کەس و لایەنانەی کە لەشوێنی خۆیان هەڵکەنراون بگەڕێنەوە بۆ زێدی خۆیان بەبێ ئەوەی ترسیان لە سزا و تۆڵەکردنەوە هەبێت.

کۆششەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان بۆ بەدەستهێنانی سەربەخۆیی ئابوری دەرهاویشتەی سەختی لەسەر گەشەپێدانی هەرێمی کوردستان و سەقامگیری نێوخۆیی هەبووە. هەرچەندە کاربەدەستانی کوردی هەرێم دەتوانن دەستیان بە داهاتێکی پێویست بگات لە فرۆشی ڕاستەوخۆیی نەوتەوە، بەڵام میکانیزمی دامەزراوەییان نییە کە دەتوانێت بەرگری لەهەرێم بکات لە ئانوساتی لێکەوتە خراپەکانی سیستەمی کرێخۆری (ڕەیعی). ئەم دامەزراوانە زۆر گرنگن چونکە کاربەدەستانی حکومەتی هەرێمی کوردستان سێکتەری وزەی خۆیان بەگەڕ دەخەن، بەتایبەت ئەوە حکومەتی هەرێمی کوردستانە کە لێپرسراوە لەمەڕ داهات و سەرچاوەی دابەشکردن و پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری نەک سەرانی بەغداد. ئەم گۆڕانکارییانە پێویستی بە سیستەمێکی دارایی شەفاف و چارەکردنی گەندەڵی و سیاسەتی یەکانگیری نەوت و داهات و چاکسازی ڕاستەقینەی سیاسی هەیە. هەروەها ئەو مەترسییانەی کە لە ئەنجامی وابەستەیی حکومەتی هەرێمی کوردستان بە تورکیاوە دروست بووە ئەوە دووپات دەکەنەوە کە سەرلەنوێ دەست کردنەوە بە دانوستان لە نێوان سەرانی هەولێر و بەغداد پێویستە، بەتایبەت بە ئامانجی مسۆگەرکردنی بوجەیەکی بەردەوام کە پشت ببەستێت بە دەستوری ساڵی ٢٠٠٥. ئەمریکا دەتوانێت ڕۆڵێکی بنەڕەتی لە ڕێکخستنی ئەو دانوستانانەدا ببینێت، هەروەها یارمەتی حکومەتی هەرێمی کوردستانیش بدات بەمەبەستی شەفافییەتی زیاتر لە دام و دەزگاکاندا کە کاریگەری بەگوڕی دەبێت لە بەڕێوەبردن و پارێزگاری کردنی ناوچەکەدا.

لە کۆتایدا، لە هەڵسەنگاندنی مەبەستی ستراتیجی هەرێمی کوردستاندا، خەملاندنی لایەنی جیۆسیاسیش بەهەمان پێوەر پێویستە. گرنگ نییە چەندە کوردەکان بە پەرتەوازەیی دەمێننەوە لەبەرئەوەی عێراقین، کوردەکان لە نێو ناوچەیەکی داخراودا دەژین کە بە وابەستەیی بەغداد دەمێننەوە، هەروەها بەشێوەیەکی زۆرتریش هەر وابەستەیی تورکیا و ئێران دەبن. ئەم ژینەگی وابەستەییبوونە بەرئەنجامەکەی لە هاوپەیمانێتییەکدایە کە نەک تەنها سنورەکان بە کراوەیی و بێ زیان دەپارێزێت، بەڵکو دەبێتە هۆکاری دابینکردنی سەرپەرشتیاری دەرەکی بۆ پارتە سیاسییە

کوردە جیاوازەکان بۆ ڕاگرتنی هاوسەنگی هێز لە نێو هەرێمی کوردستاندا. ئەوە حکومەتی هەرێمی کوردستا نییە کە تاکلایەنە جاڕی سەربەخۆیی بدات و لەوێشەوە شەپۆلێکی بەگوڕ بەنێو ناوچەکەدا بنێرێت؛ بەڵکو ئەوە ئەوە دەوڵەتانی بەهێز و بەزەبرن بە تایبەت تورکیا و ئێران کە دەتوانن کاریگەری لەسەر ڕەوتی هەرێمی کوردستان دیاری بکەن. هەتاوەکو ئەو بارودۆخانەی لەسەرەوە ئاماژەیان پێدرا لەڕەگ و ڕیشەوە گۆڕانکارییان بەسەردا نەیەت، هەرێمی کوردستان هەمیشە لە قەیرانی سیاسیدا دەبێت و لەهەمانکاتیشدا سەرقاڵی فەراهەمکردنی بەرژەوەندییەکانی خۆیەتی لە دەوڵەتە لاوازەکەی عێراقدا.

سەرچاوە: https://www.lawfareblog.com/stalemate-not-statehood-iraqi-kurdistan